

# چۆنیەتی ئەنجامدانی حەج
# بە گوێرەی بەڵگە شەرعییەکان

- حەجی تەمەتع -

((لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فإنِّي لا أَدْرِي لَعَلِّي لا أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هذِهِ))

صحيح مسلم (1297)


کۆکردنەوە وئامادەکردنی
محمد کریم علی آغا
- بەردەڕەش -



- چاپی یەکەم -
1444

**چۆنیەتی ئە نجامدانی حەج بە گوێرەی بەڵگە شەرعییەکان**

## مافی ئەم بەرهەمە پارێزراو نیە

**واتا هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە چاپ و کۆپی بکات بۆ بڵاوکردنەوە**

**بۆ داواکردنی ئەم کتێبە بە شێوەی PDF تکایە پەیوەندی بەو ژمارە یان ئیمێڵەی خوارەوە بکە ,**

**یان ئەم بارکۆدەی خوارەوە سکان بکە**

**هەر کەسێك بیەوێت بەپارە بەشداری بکات بۆ چاپکردنی ئەم کتێبە با پەیوەندی بەم ژمارەی خوارەوە بکات**

**هەر کەسێك هەڵەیەکی بینی لەم کتێبە تکایە ئاگادارمان بکاتەوە لەسەر ئەم ژمارەی خوارەوە,**


**ئیمێڵ :** muhammadblackstone@gmail.com

**ژمارەی مۆبایل :** 07508121914

**کەناڵی تیلیگرام:** https://t.me/zanstirast1439


**حزیران 2023**

**ذي القعدة 1444**



# فەهرەستی ناوەڕۆك

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الْحَمْدَ لله نَحْمَدُه ونستعينُه، ونستغفره، ونعوذُ باللهِ من شرورِ أنفسنا، ومن سيئاتِ أعمالنا، مَن يَهْدِه اللهُ فلا مُضلَّ له، ومَن يُضْلِلْ فلا هاديَ له، وأشهدُ أن لا إله إلا اللهُ وحدَه لا شريكَ له، وأشهدُ أنَّ مُحَمَّدًا عبدُه ورسولُه.[1]

أمّا بعدُ فإنَّ أصدقَ الحديثِ كتابُ اللهِ، وإنَّ أفضلَ الهدي هديُ محمدٍ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وشرَّ الأمورِ مُحدثاتُها، وكلَّ مُحدَثةٍ بدعةٌ، وكلَّ بدعةٍ ضلالةٌ، وكلَّ ضلالةٍ في النَّار.[2]

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

هەروەك ئەرکێکی سەرشانم بە پێویستم زانی ئەوەندەی لەتوانام دابێت زانستی شەرعی بۆ خەڵکی موسوڵمانی کورد نزیك بکەمەوە وە ئاسانی بکەم وە زمانێکی سادە و ساکار بەکاربهێنم, بە تایبەتی لە هەندێك عیبادەتی زۆر بەربڵاو بەڵام خەڵکێکی زۆر زانیاری تەواوی لە شێوەی ئە نجامدانی نیە. یەکێك لەو عیبادەتانە چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەرە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (کە الحمدلله چاپکراوە) وە هەروەها چۆنیەتی ئە نجامدانی حەج و عومرە بەشێوەیەکی دروست.

وە بیرۆکەی ئەم کتێبە لە چەند هۆکارێکی سەرەکی دەستی پێکرد لەوانەش:

- زۆرێك لە موسوڵمانان سەفەری عومرە وحەج دەکەن بەڵام زانیاری تەواویان نیە لەسەر ئەو دوو عیبادەتە گەورەیە, وە ئەوەش لە ئیهمالی و گوێنەدانە بە عیلمی شەرعی؛
- زۆرینەی کۆمپانیاکانی حەج و عومرە وە ئەو سەرپەرشتیارانەی کە بەناو (مامۆستای ئایینی و مەلا) خەڵك دەبەن بۆ حەج و عومرە ئەوانیش زانیاری تەواویان نیە و زۆرینەی کات بەکەیفی خۆیان و بێ عیلم ئەو عیبادەتە گەورەیە بە خەڵك دەکەن؛
- زۆرینەی ئەو کتێبانەی کە بە زمانی کوردی نووسراوەتەوە یان وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی شتەکان وەکو خۆی نقل کراوە بێ ئەوەی ئاسانکاری بکرێت لە نزیکردنەوە زاراوەکان و سادەکردنی بۆ خەڵك, کە ئەمەش نابێتە ڕێنیشاندەرێکی ئاسان بۆ کەسی حاجی یان عومرەکار لە کاتی ئە نجامدانی حەج و عومرە؛
- زۆر لەو کتێبانەی لەسەر عومرە و حەج نووسراوە, بابەتەکان بە شێوەی داڕشتن نووسراوەتەوە ئەوەش سەر لەکەسی عومرەکار یان ئە نجامدەری حەج دەشێوێنێت. تەنانەت پەرتووکە عەرەبیەکانیش زۆرینەیان بەم شێوەیە نووسراوە.

لەبەر ئەو هۆکارانە و چەندین هۆکاری دیکە, هەوڵم دا ئەو کتێبە بنووسم بە شێوەیەك کە ئاسان بێت بۆ ئەو کەسەی سەرەدانی ئەو شوێنە پیرۆزانە دەکات.

بۆ نووسینەوەی ئەم کتێبە بەدڵنیاییەوە سوودم لە زانایان و کتێبەکانیان وەرگرتووە وە بەشێوەیەکی تایبەت زۆر سوودم لە هەندێك کتێب بینیوە بۆیە بە پێویستی دەزانم ناویان بهێنم: کتێبی الحج و العمرة للشيخ الإمام محمد ناصرالدين الألباني و کتێبی تبصير الناسك بأحكام المناسك للشيخ عبدالمحسن العباد وە کتێبی الشرح الممتع على زاد المستقنع للشيخ العلامة محمد صالح العثيمين وە هەروەها الموسوعة الفقهية الميسرة وە چەندین کتێبی دیکەش وە سوودم لە چەندین هاوڕێ و برا وەرگرتووە خوای گەورە پاداشتی خێری هەموویان بداتەوە.

---

1. خطبة الحاجة للإمام محمد ناصرالدين الألباني ص6 و 7
2. صحيح الجامع 1353

**ئەمانەی خوارەوە بریتین لە چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەو کەسەی دەچێتە سەفەری حەج و عومرە:**

- **نیەتی خۆی خالص و یەکلایی بکاتەوە بۆ خوای گەورە و هیچ مەبەستی ریاء و ناو بانگ نەبێت لەو کارە وە ئەو کردەوە و عیبادەتانەی ئەنجامی دەدات تاك و تەنها بێت بۆ خوای گەورە؛**
- **ئەو کەسەی سەرەدانی ئەو شوێنە پیرۆزە دەکات پێویستە خۆی فێری ئەحکام و ئادابی ئەو عیبادەت و شوێنە پیرۆزانە بکات, لەبەر ئەوەی عیبادەت ئەگەر ئیخلاصی تێدا نەبێت بۆ خوای گەورە و لەسەر سونەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەبێت ئەوا وەرناگیرێت؛**
- **خۆی بە دوور بگرێت لە بیدعە و ئەو کردەوانەی کە لە سونەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهاتووە و صەحابەکان ئەنجامیان نەداوە. لەبەر ئەوەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت هەر کردەوەیەك لە شەرع ڕێگەی پێنەدرابێت ئەوا وەرناگیرێت وڕەتدەکرێتەوە.**

**خوای گەورە دەفەرموویێت:**

﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾[1]

**وە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت: ((إنَّمَا الأعْمالُ بالنِّيَّاتِ، وإنَّما لِكُلِ امْرِئٍ مَا نَوى))[2]**

**وە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت: ((مَن عَمِلَ عَمَلًا ليسَ عليه أمْرُنا فَهو رَدٌّ))[3]**

- **خۆ بە دوورگرتن لە وێنەگرتن وبلاوکردنەوە و پۆستکردنی وێنە, خەڵکێکی زۆری ئەنجامدەرانی حەج و عومرە بە شێوەیەکی بەربڵاو تووشی ئەو کارە بوونە, وە وێنەگرتن جگە لەوەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهی لێکردووە و حەرامە, لە هەمان کاتدا مرۆڤی موسوڵمان تووشی ریا و ناوبانگ دەکات. وە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە دڵی لە دڵی هەموو کەسێك خاوێن ترە و لە هەموو کەسێك تەقوا ترە, کەچی لەکاتی ئەنجامدانی حەج و عومرە لەخۆی ترساوە لە ریا و ناوبانگ وە داوای لەخوای گەورە کردووە کە بیپارێزێت لە ریا و ناوبانگ؛**
- **زۆر گرنگە کەسی حاجی لەکاتی سەفەری حەج لە سەرەتای دەرچوونی لە ماڵ تاکو دەگەڕێتەوە لە گوناح و تاوان بەهەموو شێوەیەك بە دوور بگرێت وە خۆی تووڕە نەکات وە هاوار نەکات و موناقەشە و موجادەلە نەکات ئەگەر پێویست نەبوو, ئەگەر ئەو شتانەی نەکرد و حەجێکی ڕێك و جوانی کرد ئەوا خوای گەورە لە هەموو گوناحەکانی خۆش دەبێت.**

---

1. سورة الكهف (110)  2. صحيح البخاري (1)  3. صحيح مسلم (1718)

**ئەمانەی خوارەوە بریتین لە چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەو کەسەی دەچێتە سەفەری حەج و عومرە:**

- پێویستە ئێمەی موسولمان بزانین وە باوەڕمان وابێت کە شاری مەککە و مزگەوتی حەرام و کەعبە و شاری مەدینە و مزگەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شوێنی پیرۆزن و گوناح تێیاندا گەورەترە لە شوێنی دیکە, بەڵام نابێت هیچ شوێنێك ماچ بکەی یان خۆتی پێ بنووسێنی تەنها ئەو شوێنانە نەبێت کە شەرع ڕێگەی پێداوە وەکو بەردی ڕەش ( حجر الأسود ) وە هەروەها ملتزم (بەینی دەرگای کەعبە و حجر الأسود ), جگە لەمانە هیچ شوێنێکی دیکە دروست نیە ماچ بکەی وە خۆتی پێ هەڵبواسی, وە عمر رَضِيَٱللَّهُعَنْهُ کە بەردی ڕەشی ماچ دەکرد دەیفەرموو: واللە من دەزانم تۆ بەردی و هیچ سود و زیانێکت نیە , بەڵام بینیتم پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ماچی دەکردی بۆیە منیش ماچت دەکەم؛
- پێویستە ئێمەی موسولمان بزانین وە باوەڕمان وابێت هەموو شتێك لە ژێر دەسەڵاتی خوای گەورەیە نەك دار و بەرد و مزگەوت و قەبر, بۆیە خۆمان بۆ خوای گەورە بشکێنینەوە و داوای هەموو شت لە خوای گەورە بکەین.
- ئەخلاقی خۆی جوان بکات و بەردەوام ڕەوشتی جوان پیشان بدات بە تایبەت یارمەتی دانی یەکتری وە تووڕە نەبوون وە سەبر وئارامگرتن چونکە لەسەفەر مرۆڤ تووشی هەموو جۆرە کەسێك دەبێت وە تووشی نارەحەتی زۆر دەبێت؛
- بەردەوام کاتی خۆی بە زیکر و دوعا و داوای لێخۆشبوون بەسەر ببات وە خەریکی شتی بێ سوود نەبێت وەکو وێنەگرتن و قسەی لابەلا و بێ سوود لەگەڵ خەڵکی بیانی؛
- ئاگاداربێت خەڵکی دیکە ئەزیەت نەدات چ لە ڕێگای سەفەرکردنەکە بێت یاخود لەکاتی ئە نجامدانی کردەوەکانی عومرەبێت بەتایبەت چوونە نزیك حجر الأسود و ڕەوضە لە مزگەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و شوێنەکانی دیکەش.

## لەکاتی دەرچوون لە ماڵ

(( بِسْمِ اللهِ توكّلتُ على اللهِ، لا حَولَ ولا قُوَّةَ إلَّا باللهِ ))[1]

## دوعای ئەو کەسەی دەچێتە سەفەر بۆ ئەو کەسەی لەماڵ دەمێنێتەوە

(( أستودِعُكَ اللهَ الذي لا يُضيِّعُ ودائِعَهُ ))[2]

## دوعای ئەو کەسەی لەماڵەوە دەمێنێتەوە بۆ ئەو کەسەی دەچێتە سەفەر

(( أستَودِعُ اللهَ دِينَكَ، و أمانتَكَ، و خَواتِيمَ عملكَ ))[3]

(( زوَّدَكَ اللهُ التقوى، وغفر ذنبَكَ، ويَسَّرَ لكَ الخيرَ حيثُمَا كنتَ ))[4]

## دوعای چونە ناو ئۆتۆمبێل

بِسْمِ اللهِ، الحَمْدُ للهِ

﴿سُبْحَانَ الذي سَخَّرَ لَنَا هذا، وَما كُنَّا له مُقْرِنِينَ، وإنَّا إلى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ﴾

الحَمْدُ للّه، الحَمْدُ للّه، الحَمْدُ للّه، اللَّهُ أكبَرُ، اللَّهُ أكْبَرُ، اللَّهُ أكْبَرُ،

سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ إنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي، فَاغْفِرْ لِي، فَإنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلَّا أنْتَ.[5]

## دوعای چوونە سەفەر

(( اللَّهُمَّ إنَّا نَسْأَلُكَ في سَفَرِنَا هذا البِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ العَمَلِ ما تَرْضَى، اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هذا، وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ في السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ في الأهْلِ، اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بكَ مِن وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ المَنْظَرِ، وَسُوءِ المُنْقَلَبِ في المَالِ وَالأهْلِ ))[6]

## لەکاتی گەڕانەوە هەمان دوعا دەکەی وە ئەمەشی بۆ زیاددەکەی:

(( آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ ))[6]

---

1. صحيح أبي داود (5059) 2. صحيح ابن ماجة (2295) 3. صحيح الترمذي (3443)
4. صحيح الترمذي (3444) 5. صحيح الكلم الطيب (173) 6. صحيح مسلم (1342)

سەرەدانی شاری مەدینە و مزگەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هیچ پەیوەندی بە حەج و عومرە نیە, بەڵام لەبەر ئەوەی شوێنێكی پیرۆزە و ئیسلامیش ڕێگەی پێداوە سەرەدانی بكەین, بۆیە بۆمان هەیە سەرەدانی بكەین بەمەبەستی عیبادەت.

ئەمانەی خوارەوە چەند ڕێنماییەك و هەندێك كردەوەیە كە لە شاری مەدینە ئە نجام دەدرێت:

**1.** یەك نوێژ لە مزگەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خێر وپاداشتی زیاترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەكانی تر تەنها مزگەوتی الحرام نەبێت[1]

كە دەچیتە ناو مزگەوت: وەكو هەموو مزگەوتێكی دیكە

- پێی ڕاست پێش دەخەی وە دوعای چوونە ناو مزگەوت دەخوێنی:

((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلِّمْ, اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أبْوابَ رَحْمَتِكَ))[2]

((أعُوذُ بِاللهِ العَظِيمِ وَ بِوَجْهِهِ الكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ القَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ))[3]

- دوو ركاعەت تحية المسجد دەكەی پێش ئەوەی دابنیشیت:



- لەكاتی دەرچوون لە مزگەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەكو هەموو مزگەوتێكی دیكە پێی چەپت پێشدەخەی وە دوعای چونە دەرەوە لە مزگەوت دەكەی:

((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلِّمْ, اللَّهُمَّ إنِّي أسْأَلُكَ مِن فَضْلِكَ))[4]

((اللَّهُمَّ اعصِمني مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيمِ))[5]

---

1. البخاري (1190)  2. صحيح ابي دواد (465)  3. صحيح ابي دواد (466)

4. صحيح ابي دواد (465)  5. صحيح ابن ماجه (634)

2. بۆت هەیە سەردانی قەبری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکەیت بەم شێوەیەی خوارەوە:

- لەبەرامبەر قەبری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەڵێ ی: السلام عليك يا رسول الله
- پاشان شەقاوێکی گەورە دەچیتە پێش دەکەویتە بەرامبەر قەبری ئەبو بکر دەڵێ ی: السلام عليك يا أبا بكر
- پاشان شەقاوێکی بچوك دەچیتە پێش دەکەویتە بەرامبەر قەبری عمر دەڵێ ی: السلام عليك يا عمر



- ✗ پێویستە دەنگی خۆت بەرز نەکەیتەوە لەبەرامبەر قەبری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە بەشێوەیەکی رێك و بەرێزەوە بجولێیەوە وە خۆت بەشتی لا بەلا و رەسم گرتن خەریك نەکەی چونکە ئەمە بێ ئەدەبیە بەرامبەر پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.
- ✗ ئاگاداربە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهی کردووە زۆر سەردانی قەبری بکەی وە دوعای کردووە کە قەبری نەبێتە جێی ئەوەی خەڵك زۆر سەردانی بکات و دوعای کردووە قەبری نەبێتە جێ ی ئەوەی خەڵك عیبادەتی بکات یان لێ ی بپارێتەوە؛[1]
- ✗ ئاگاداربە دروست نیە دوعا لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکەیت یان لەبەرامبەر قەبری بپارێیەوە چونکە ئەوە شوێنی دوعا نیە وە هەر خوای گەورە تاك و تەنها شایستەی دوعاکردنە و دوعا وەڵام دەداتەوە؛
خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾[2]
- ✗ دروست نیە لەبەرامبەر قەبری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بڵێ ی فلان سەلامت لێدەکات یان سەلامی ئەو خەڵکەت دەگەیەنمێ...هتد. لەبەر ئەوەی: ئەوە شتێکی داهێنراو و بیدعەیە و شەرع رێگەی پێ نەداوە وە لەبەر ئەوەی هەرکەسێك لە هەر شوێنێك بێت صەلاوات و سەلام لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکات ئەوا خوای گەورە مەلائیکەتی داناوە بۆ ئەوەی ئەو صەلاوات و سەلامە بگەیێنە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. بۆیە پێویست بە هیچ کەس ناکات سەلام بگەیێنێتە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

---

1. صحيح ابي دواد (2042) و فقه السيرة للألباني (ص53)   2. سورة الجن (18)

3. لە مزگەوتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ شوێنێك هەیە کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ وەصفی کردووە بەوەی کە مێرگێك یان باخێکە لە باخەکانی بەهەشت:

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: ((ئەو شوێنەی دەکەوێتە نێوان ماڵی من (ئێستا قەبری پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) و مینبەرەکەم بریتیە لە باخێك لە باخەکانی بەهەشت))[1].

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو شوێنە گەورەیی و تایبە تمەندی خۆی هەیە لە ئە نجامدانی نوێژی سوننەت و خوێندنی قورئان و زیکرکردن لەو شوێنە ئەگەر نەبێتە هۆکاری ئەزیەت دانی خەڵك و دروست کردنی قەڵەبالغی.

بەڵام نوێژە فەرزەکان لە ڕیزی پێشەوەی مزگەوت خێری زیاترە لەو شوێنە.

4. وە هەروەها لەشاری مەدینە بۆت هەسە سەردانی قەبرستانی شەهیدانی جەنگی ئوحود بکەی هەروەك پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ سەردانی کردوون؛

کە نزیك دیواری قەبرستان بووی سەلام دەکەی هەروەکو سەلامکردنی هەر قەبرستانێکی دیکە:

((السَّلامُ عليكم أهْلَ الدِّيارِ من المؤمنينَ والمُسلمينَ، وإنَّا إنْ شاءَ الله لَلاحِقونَ، أسأَلُ الله لنا ولكم العافِيةَ))[2]

وە لەو شوێنە چیای ئوحود هەیە، ئەو چیایە فەزل و گەورەیی زۆری هەیە لەئیسلامدا وە ئیمانداران پێویستە چیای ئوحودیان خۆش بوێ هەروەك پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت:

((ئەوە ئوحودە چیایێکە ئێمەی خۆشدەوێت و ئێمەش ئەومان خۆشدەوێت))[3]


چیای ئوحود


گۆڕستانی شەهیدانی جەنگی ئوحود

1. صحيح البخاري (1195) و صحيح مسلم (1390)
2. صحيح مسلم (975)  3. صحيح البخاري (4422)

5. لە شاری مەدینە بۆت هەیە سەرەدانی قەبرستانی بەقیع بکەی

وە کاتێك چوویە ژوورەوە سەلام دەکەی هەروەکو سەلامکردنی هەر قەبرستانێکی دیکە:

(( السَّلامُ عليكم أهْلَ الدِّيارِ من المؤمنينَ والمُسلمينَ،
وإنَّا إنْ شاءَ الله لَلاحِقونَ، أسأَلُ الله لنا ولكم العافِيَةَ ))[1]



6. سونەتە سەرەدانی مزگەوتی قوباء بکەی وە نوێژێکی لێ بکەی:

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت:

(( هەر کەسێك لە ماڵی خۆی دەستنوێژ بگرێت پاشان بچێتە مزگەوتی قوباء و نوێژێکی تێدا بکات ئەوا خێر وپاداشتەکەی وەکو ئەنجامدانی عومرەیەکە ))[2]

وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕۆژانی شەممە سەرەدانی مزگەوتی قوبای دەکرد.



---

1. صحيح مسلم (975) 2. صحيح ابن ماجة (1168)

## روکنەکانی عومرە

بریتیە لەو کردەوانەی ئەگەر ئەنجامی نەدەیت عومرەکەت بەتاڵ دەبێتەوە:

1. ئیحرام کردن
2. طواف کردن
3. هاتن و چوون لەنێوان صەفا و مەروە

## واجباتی عومرە

بریتیە لەو کردەوانەی ئەگەر بە ئەنقەست ئەنجامی نەدەیت ئەوا گوناح بار دەبیت وە دەبێت حەیوانێك سەر ببڕی بەڵام عومرەکەت بەتاڵ نابێتەوە

نابێت بەخۆت ئەو حەیوانە بخۆیت بەڵکو دەبێت بیکەیە خێر بەسەر خەڵکی هەژاری شاری مەککە

1. چوونە ژێر ئیحرام لە میقات
2. تاشینی قژی سەر بەتەواوی یان کورت کردنەوەی قژی سەر لە کۆتایی عومرە.

## سونەتەکانی عومرە

بریتیە لە هەموو ئەو کردەوانەی کە لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە بەڵام لەسەرەوە باسنەکراوە ئەو کردەوانە ئەنجام بدەی خێرت دەگات وە ئەنجامی نەدەی هیچ گوناحبار نابیت

## 10 شێوازی ئەنجامدانی حەج

## پێش چوونە ژێر ئیحرام




1. پێش چوونە ژێر ئیحرام خۆشووشتن سونەتە
2. بۆن خۆش کردنی سەر و لاشە بۆ پیاوان سونەتە
(نابێت بۆن لە جل و بەرگی ئیحرام بدرێت)




3. لەبەر کردنی جل و بەرگی ئیحرام بۆ پیاوان
کە بریتیە لە دوو پارچە قوماش (رداء) بۆ داپۆشینی بەشی سەرەوەی لاشە و (إزار) بۆ داپۆشینی بەشی خوارەوەی لاشە





پیاو نابێت هیچ شتێك لەسەر سەری بێت ڕاستەوخۆ (وەکو کڵاو و جامانە)
پیاو نابێت جل و بەرگێك لەبەر بکات کە دوورابێت بە قەدەر لاشەی
(واتا: شوێنی دەست و پێ و ملی دروستکرابێت)



4. ئافرەت بە جل و بەرگی ئاسایی خۆی ئیحرام دەکات



وە نابێت و دەست کێشی لە دەست بێت
وە نابێت نیقاب بکات بەشێوەیەك کە بەدەم وچاوی نووسابێت
بەڵکو دروستە ئەگەر لەسەر سەری هاتبێتە خوارەوە وە نە نووسابێت بە دەم و چاوی ڕاستەوخۆ (بە تایبەت ئەو کاتەی پیاوی بێگانە دەیبینن)

## ئەو شتانەی دروست نیە ( حەرامە ) بۆ ئەو کەسەی لە ژێر ئیحرامدایە

- ❌ پیاو نابێت هیچ شتێك لەسەر سەری بێت ڕاستەوخۆ ( وەکو کڵاو و جامانە )؛
- ❌ پیاو نابێت جل و بەرگێك لەبەر بکات کە دوورابێت بە قەدەر لاشەی ( واتا : شوێنی دەست و پێ و ملی دروستکرابێت )؛
- ❌ نابێت پیاو پێڵاو یان خف لەپێبکات کە هەردوو قاپی پێی دادەپۆشێت؛
- ❌ نابێت پیاو بچێتە لای خێزانی بۆ جیماع وە هەر پێشەکیەکی ئەو کارە ( وەکو ماچ و خۆ لێ نزیك کردنەوە و باسکردنی ئەو بابەتە ) ؛
- ❌ ژن مارەکردن لەکاتی ئیحرامدا دروست نیە جا چ بۆخۆی بێت یان بۆ کەسێکی دیکە مارە بکات؛
- ❌ دروست نیە ئەو کەسەی لە ژێر ئیحرامە مناقشە و مشت و مڕ بکات؛
- ❌ ڕاوکردن و کوشتنی ئاژەڵی ووشکانی؛
- ❌ جل و بەرگی ئیحرام نابێت بۆنی لێدرابێت؛
- ❌ لێکردنەوەی نینۆك و موو بە ئەنقەست بەهەموو شێوەیەك حەرامە ؛
- ❌ بۆن خۆشکردنی لاشەو جل و بەرگ لەکاتی ئیحرامدا حەرامە ؛
- ❌ ئافرەت نابێت دەست کێشی لە دەست بێت؛
- ❌ ئافرەت نابێت نیقاب بکات بەشێوەیەك کە بەدەم وچاوی نووسابێت بەڵکو دروستە ئەگەر لەسەر سەری هاتبێتە خوارەوە وە نە نووسابێت بە دەم و چاوی ڕاستەوخۆ ( بە تایبەت ئەو کاتەی پیاوی بێگانە دەیبینن )؛

## ئەو شتانەی دروستە بۆ ئەو کەسەی لە ژێر ئیحرامدایە

- خۆ شووشتن دروستە لەو کاتەی لەژێر ئیحرامی؛
- ئەگەر کەسێك سەر یان ڕیشی بخورێنێت مووی لێ ببێتەوە هیچ کێشەی نیە ئەگەر بە ئەنقەست موو لێنەکاتەوە؛
- فڕێدانی ئەو نینۆکەی کە دەشکێت بێ ئەنقەست؛
- دروستە قایش ببەستی بۆ توندکردنی جلی ئیحرام؛
- دروستە لە دەست کردنی سەعات و گوستیلە و چاویلگە؛
- دروستە جل و بەرگی ئیحرام بگۆڕی ئەگەر پیس بوو؛
- ئەو کەسەی لە ژێر ئیحرامە دروستە بچێتە ژێر سێبەری سەیوان و کەپر و ژێر سەقفی ئۆتۆمبێل
- ئەو ئافرەتەی لە سووری مانگانەدایە ئەوا ئیحرام دەکات و هەموو کارەکانی عومرە ئە نجام دەدات تەنها طواف دوا دەخات تاکو خاوێن دبێتەوە؛
- دروستە ئافرەت پێلاو لە پێبکات تەنانەت ئەگەر قاپیلکەی پێ ش دابپۆشێت
- دروستە ئافرەت لە کاتی ئیحرامدا زێر و زیوی لەبەر بێت؛

**پاشان لە میقات دەبێت بچیتە ژێر باری ئیحرام بەم کردەوانەی خوارەوە:**

1. هێنانی نیەت بەدڵ (کە دەچیتە ژێر ئیحرام)
2. ووتنی تەلبیە بە مەبەستی چوونە ژێر ئیحرام:

(لَبَّيكَ اللَّهُمَّ عُمرَةً لا رِيَاءَ فِيهَا وَلا سُمعَة)

(لبَّيكَ اللّهمَّ لبَّيك، لبَّيكَ لا شريكَ لَكَ لبَّيكَ إنَّ الحمدَ والنِّعمةَ لَكَ والملكَ ، لا شريكَ لَكَ)

3. ئەگەر ترست هەبوو لەوەی نەتوانی عومرەکەت تەواو بکەیت لەبەر نەخۆشی یان هەر هۆکارێکی دیکە, ئەوا بۆت هەیە بڵێی (اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي),[1]

باشتر وایە بچیتە ژێر ئیحرام و تەلبیە بکەی ئەو کاتەی کە ویستت بەڕێ بکەوی بۆ مەککە و ڕووت بەرەو قیبلەیە (واتا کە چوویە ناو ئۆتۆمبێل و ڕووت کردە مەککە)[2]

4. پاشان دەست دەکەیت بە ووتنی زیکری تەلبیە:

(لبَّيكَ اللّهمَّ لبَّيكَ ، لبَّيكَ لا شريكَ لَكَ لبَّيكَ إنَّ الحمدَ والنِّعمةَ لَكَ والملكَ ، لا شريكَ لَكَ)

یان (لبّيْكَ إلهَ الحقِّ)

- ❌ چونە ژێر ئیحرام هیچ نوێژی لەگەڵ نیە
- ✅ بەڵام سونەتە لە (ذو الحليفة) کە میقاتی خەڵکی مەدینەیە دوو رکاعەت نوێژی سونەت بکەی[3]



ئێرە (ذو الحليفة) یە, کە بریتیە لە میقاتی خەڵکی مەدینە وە میقاتی ئەو کەسانەیە کە خەڵکی مەدینە نین بەڵام بەو ڕێگایە دەڕۆن بۆ مەککە

**تێبینی:** خەڵکێکی زۆر (ذو الحليفة) بە (أبيار علي) ناو دەبات, ئەوەش هەڵەیە دەبێ موسوڵمانان بە گشتی و بە تایبەت مامۆستایانی ئایینی خۆیان لێ بەدوور بگرن چونکە ئەو ناوە لە بیروباوەڕێکی پووچەڵ هاتووە گوایە علی رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لەو شوێنە شەڕی جنۆکەی کردووە.

---

1. صحيح البخاري (5089) و صحيح مسلم (2903)
2. صحيح البخاري (1552) و صحيح مسلم (2821)
3. صحيح البخاري (1534)

- لە ڕێگای چوون بۆ مەککە سونەتە زۆر تەلبیە لێ بدەی
(لبَّيكَ اللّهمَّ لبَّيك، لبَّيكَ لا شريكَ لَكَ لبَّيك إنَّ الحمدَ والنِّعمةَ لَكَ والملك ، لا شريكَ لَكَ)
یان (لبّيْكَ إلهَ الحقِّ)
- سونەتە پیاوان دەنگیان بەرز بکەنەوە لەکاتی تلبیە لێدان (بە ڕادەیەک بگاتە هاوارکردن)
- ئافرەتانیش بۆیان هەیە دەنگیان بەرز بکەنەوە ئەگەر دەنگیان نەگات بە پیاوان و فیتنەی لێ دروست نەبێ
- ✗ تەلبیە لێدان بەکۆمەڵ وە بە یەک دەنگ دروست نیە بەڵکو هەرکەسێك بۆ خۆی تەلبیە لێ دەدات.
- سەرپەشتیار (مرشد) یان مامۆستای ئایینی بۆی هەیە لە سەرەتای بەڕێکەوتن بۆ مەککە کەسانی عومرەکار فێری تەلبیە بکات پاشان هەرکەس بۆ خۆی تەلبیە لێبدات



- تەلبیە لێدان بەردەوام دەبێت تاکو نزیك سنووری حەرم بووی و ماڵ و ئاوەدانی شاری مەککەت لێ دیارکەوت تەلبیە لێدان دەوەستێنی هەروەکو لە عبداللە کوڕی عمر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ هاتووە[1]
- وە بۆت هەیە بەردەوام لە تەلبیە لێدان هەتا دەگەیتە مسجد الحرام هەروەکو لە عبداللە کوڕی عباس رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ هاتووە؛[2]
- ئەگەر بگونجێ و بۆت ئاسان بێت سونەتە پێش بچیتە ناو شاری مەککە خۆت بشۆی؛[3]

**تەلبیە واتا وەڵام دانەوە، وە خوای گەورە بانگی خەڵکی کردووە بۆ سەرەدانی کردنی ماڵی خۆی، بۆیە موسڵمان کاتێك دەگاتە میقات وە کەوتە ژێر ئیحرام تەلبیە لێدەدات، ئەوەش مانای ئەوەیە، ئەی پەروەردگار تۆ بانگی منت کرد بۆ سەرەدانی کردنی ماڵی خۆت وە هەر خۆت بۆمت ئاسان کرد، ئەوە منیش وەڵامت دەدەمەوە بە بەردەوامی و یەك لەدوای یەك (لبيك اللهم لبيك)**

---

1. صحیح البخاري (1573)   2. سنن البیهقي (104/5)   3. صحیح البخاري (1573)

## گەیشتنە مزگەوتی حەرام (مسجد الحرام) لە شاری مەککە

- لەکاتی چوونە ناو مزگەوتی حەرام, قاچی ڕاست پێش دەخەی و سونەتە دوعای چوونە ناو مزگەوت بخوێنی:

((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلِّمْ, اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِكَ))

((أعُوذُ بِاللهِ العَظِيمِ وَ بِوَجْهِهِ الكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ القَدِيمِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ))

- پاشان بۆت هەیە بڵێی: ((اللَّهمَّ أنتَ السَّلامُ ومِنْكَ السَّلامُ, فَحَيِّنا رَبَّنا بالسَّلام)) , هەروەك لە عمر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ هاتووە[1].

- ✗ کەسی عومرەکار کە چووە ناو مزگەوتی حەرام بەمەبەستی طواف پێویست بە دوو رکاعەت تحیه المسجد ناکات بەڵکو دوای تەواو بوون دوو رکاعەت سونەتی طواف دەکەی



1. ابن أبي شيبة (7/ 103) و سنن البيهقي (7/73)

## یەکەم کردەوەی عومرە کردن لە مسجد الحرام بریتیە لە طواف کردن

- طواف بریتیە لە حەفت جار سوڕانەوە بەدەوری کەعبەی پیرۆز
- لە حجر الأسود (بەردی ڕەش) دەستپێدەکات و لەوێشەوە کۆتایی پێ دێت.
- طواف پێویستی بە دەستنوێژە
- هەر حەفت شەوتی طواف پێویستە لە دوای یەك ئە نجام بدرێت
- بەڵام ئەگەر لەکاتی طواف کردن بوو بە کاتی نوێژ ئەوا دروستە نوێژ بکەیت پاشان طواف تەواو بکەی
- ئەگەر تووشی ماندوو بوون بوی لەکاتی طواف کردن, دروستە پشوویەك (ئیسراحەتێك) بکەی پاشان طواف تەواو بکەی



1. کە ویستت طواف دەست پێبکەی دەچیتە بەرامبەر حجر الأسود:

- ١ – ئەگەر بتوانی ئەوا ماچی دەکەی وە دەڵێی (بسم الله, الله أكبر), ئەگەر نەکرا ئەوا
- ٢ – دەستت بە حجر الأسود دادەهێنی و دەستی خۆت ماچ دەکەی و دەڵێی (بسم الله, الله أكبر), ئەگەر بۆت نەکرا ئەوا
- ٣ – لە دوورەوە یەك دەستی بۆ بەرز دەکەیەوە (بێ ئەوەی دەستت ماچ بکەی) و دەڵێی (بسم الله, الله أكبر)

ئەو سێ حالەتەی سەرەوە لە سەرەتای هەر ٧ جار سوڕانەوەکان دەبێت.







2. کە دەست دەکەی بە طواف کردن, دەبێت کەعبە لە لای دەستی چەپت بێت

- سونەتە پیاوان لە سێ جاری یەکەم بەشێوەیەکی خێراتر بڕۆن (رمل) وە شانیان بهەژێنن
- سونەتە بۆ پیاوان تەنها لەکاتی طواف لەژێر جلی إحرام شانی ڕاستیان دەربهێنن, ئەو کارە پێی دەوترێت (إضطباع)






3. سونەتە کە گەیشتیە رکن اليمانی دەستی پێدا بهێنێ
(بێ ماچ کردن و بێ ووتنی هیچ شتێك)
ئەگەر بۆت نەکرا دەستی پێدا بهێنێ (ئەوا ئیشارەی بۆ ناکەی)

4. سونەتە لە نێوان رکن اليمانی (A-) و حجر الأسود (B-) بڵێ
(رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وفي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

5. کە گەیشتیەوە حجر الأسود ئەوا **یەك** سورانەوە تەواو بوو




6. دوای تەواو بوونی حەفت جار سووڕانەوە بە دەوری کەعبە,
ئەگەر بۆت کرا سونەتە بچیتە لای (ملتزم)
کە دەکەوێتە نێوان حجر الأسود و دەرگای کەعبە
سینگ و دەم و چاو و دەست و قوڵی پێوە بنووسێنیت وە دوعا بکەی

المقام



5. پاشان دەچیتە بەرامبەر مقام وە ئەو ئایەتە دەخوێنی
﴿وَاتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾

6. پاشان دوو رکاعەت سونەت ئەنجام دەدەی لە پشتی مقام یان هەر شوێنێکی دیکەی مزگەوت
- لە رکاعەتی یەکەم لە دوای فاتیحە سونەتە [سورة الكافرون] ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ بخوێنی
- وە لە رکاعەتی دووەم لە دوای فاتیحە سونەتە [سورة الإخلاص] ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنی

7. پاشان دەچی بەرەو ئاوی زەمزەم و دەخۆیەوە بە **زۆری** وە بەسەری خۆت دادەکەی

8. پاشان دەچیتە بەرامبەر حجر الأسود, ئەگەر بتوانی ئەوا ماچی دەکەی وە دەڵێی (بسم الله, الله أكبر)
ئەگەر نەکرا ئەوا دەستت بە حجر الأسود دادەهێنی و دەستی خۆت ماچ دەکەی و دەڵێی (بسم الله, الله أكبر)
ئەگەر بۆت نەکرا ئەوا لە دوورەوە دەستی بۆ بەرز دەکەیتەوە (بێ ئەوەی دەستت ماچ بکەی)
و دەڵێی (بسم الله, الله أكبر)

9. ئەلێرە طواف کردنەکەت تەواو بوو.

## لە دوای تەواو بوون لە طواف بەرەو صەفا و مەروە دەڕۆیت

- صەفا و مەروە بریتین لە دوو چیا
- کە لە چیای صەفا نزیك بوویە ئەو بەشەی ئایەت دەخوێنیتەوە: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللَّهِ﴾
- پاشان دەڵێی: (نَبْدَأُ بما بَدَأَ اللهُ بِــه)
- پاشان دەچیتە سەر چیای صەفا تاکو کەعبەت لێ بە دیاردەکەوێت وە روو دەکەیتە کەعبە وە دەستەکانت بەرز دەکەیتەوە و ٣ جار دەڵێی:

((لا إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الـمُلْكُ ولَهُ الـحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ، لَا إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ))

- وە لەنێوان هەرجارێك دوعا دەکەیت بەو دوعایانەی کە خۆت دەتەوێت.

- پاشان بەرەو چیای مەروە بەرێ دەکەوی بە ڕۆیشتن,
- کە گەیشتیتە هێما سەوزەکە بۆ پیاوان سونەتە بەخێرایی بڕۆی (ڕاکردن) تا دەگەیتە هێمای سەوزی دووەم دیسان ڕۆیشتنی ئاسایی دەکەی تاکو دەگەیتە چیای مەروە

- بەهەمان شێوە سەردەکەویتە سەر چیای مەروە تاکو کەعبەت لێ دیاردەکەوێت وە روو دەکەیتە کەعبە وە دەستەکانت بەرز دەکەیتەوە وە ٣ جار دەڵێی:

((لا إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الـمُلْكُ ولَهُ الـحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ، لَا إلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ))

- وە لەنێوان هەرجارێك دوعا دەکەیت بەو دوعایانەی کە خۆت دەتەوێت.

- پاشان بەرێدەکەوی بۆ گەڕانەوە بەرەو چیای صەفا,

بەم شێوەیە ٧ جار هاتن و چوون لەنێوان صەفا و مەروە دەکرێت

صفا --١-> مروة --٢-> صفا --٣-> مروة --٤-> صفا --٥-> مروة --٦-> صفا --٧-> مروة

- ✗ لەکۆتا جار کە دەگەڕێیتەوە چیای مەروە, ئەو دوعایە سەرەوە ناخوێنی
- ✗ لە نێوان صەفا و مروە هیچ دوعایەك لە پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهاتووە
- ✗ تەنها ئەم دوعایەی خوارەوە لە عبداللە ی کوڕی مەسعود و عبداللە کوڕی عومەر هاتووە[1] بە تایبەت لەنێوان هەردوو نیشانە سەوزەکە: (ربِّ اغفر وارحم؛ إنك أنت الأعز الأكرم)
- هاتن و چوون لەنێوان صەفا و مەروە, لە صەفا دەست پێدەکەیت وە لە مەروە کۆتایی پێدێت

1. ابن ابي شيبة (68/4 و 69)


چیای صەفا
دەستپێك
7
6
5
4
3
2
1
کۆتایی ( لە کۆتا جار گەیشتن بە مەروە دوعا ناخوێنی لێرە )
چیای مەروە
ڕۆیشتنی ئاسایی
ڕۆیشتنی خێرا ڕاکردن
ڕۆیشتنی ئاسایی
لەسەر هەردوو چیا
روو کردنە قیبلە وە بەرزکردنەوەی دەستەکان وە 3 جار دەڵێی: (( لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الـمُلْكُ ولَهُ الـحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ،
لَا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ ))
وە لەنێوان ووتنی هەرجارێك ئەو زیکرە سونەتە دوعا بکەیت بەو دوعایانەی کە خۆت دەتەوێت.

## کە لە ڕۆیشتن لە نێوان چیای صەفا و چیای مەروە تەواو بوویت

- واجبە لەسەر پیاو قژی سەر بە تەواوی بتاشێ یاخود کورتی بکاتەوە
- واجبە لەسەر ئافرەت قژی کۆ بکاتەوە و بەقەدەر یەك سەرە پە نجە بیبڕێت

**بە ئە نجامدانی ئەمە عومرەکەت کۆتایی پێدێت وە لەژێر ئیحرام دێیتە دەرەوە**

**چاوەڕێ دەکەیت تاکو ڕۆژی ٨ی ذي الحجة ڕۆژێك پێش عەرەفە ئەوکاتە کردەوەکانی حەج دەستپێدەکات**

**تێبینی 1:** قژ تاشین بەتەواوی باشترە لە کورت کردنەوە, چونکە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سێ جار دوعای لێخۆشبوونی بۆ ئەو کەسانە کرد کە سەریان تاشی و تەنها یەك جار دوعای لێخۆشبوونی بۆ ئەو کەسانە کرد کە قژیان کورت کردەوە.

**تێبینی 2:** دروست نیە پیاو تەنها بەقەدەر پە نجەیەك پرچی کورت بکاتەوە وەکو ئافرەت, بەڵکو واجبە پیاو هەموو سەری **بتاشێت** یان **کورتی بکاتەوە** چۆن لە کاتی ئاسایی دەچێتە لای سەرتاش ( حلاق ).

وە لێرە نموونەیەك دەهێنینەوە بۆ ئەو کەسانەی لە کۆتایی عومرە تەنها بە قەدەر یەك پە نجە قژیان کورت دەکەنەوە لە چەند لایەکی سەریان بۆ ئەوەی بزانن کە ئەو کارە دروست نیە وە تەنها خۆ هەلخەلەتاندنە:

خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێت:

﴿لَّقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾[1]

واتا قژی خۆیان دەتاشن یان کورتی دەکەنەوە ( سەریان چا دەکەن ),

باشە بۆ نموونە (ولله المثل الأعلى) لە ژیانی ڕۆژانە ئەگەر بە کوڕەکەت یان برای بچووکت بڵێی بڕۆ سەرتاش ( حەلاق ) قژی سەرت کورت بکەوە و قژی سەرت چاکە, کوڕەکەت بچێت تەنها چەند تالە موویێك ببڕێت و بلێت بابە قژم چاککرد, تۆ چی پێ دەلێ ی؟! ڕازی دەبی بەو ئیشەی یان تووڕە دەبی؟!

چ جای خوای گەورە و پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەمرت پێدەکەن قژی سەرت چا بکەی تۆش بچیت تەنها چەند تالە موویێك لێ بکەیتەوە؟! ئایا ئەمە جێبەجێکردنی ئەمری خوای گەورەیە یان خۆ هەلخەلەتاندنە؟ والله المستعان

## چەند ئاگادارکردنەوە و هۆشیارکردنەوەیەکی زۆر گرنگ:

❌ دروست نیە بچیتە مزگەوتی عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا (التنعیم) بۆ ئەنجامدانی عومرەیەکی دیکە چونکە ئەو شوێنە تەنها بۆ دایکمان عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا بوو بەهۆی نەخۆشیەوە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕێگەی پێداوە وە ئەو ڕێگە پێدانە تەنها ئەو ئافرەتانە دەگرێتەوە کە وەکو عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا عوزریان هەیە. وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عبدالرحمن کوڕی ئەبو بکر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا برای عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا لەگەڵ عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا نارد بەڵام عومرەی نەکرد بۆخۆی لەبەر ئەوەی دەیزانی بۆ ئەو ڕێگە پێدانە بۆ ئەو نیە بەڵکو تەنها بۆ دایکمان عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا یە.

**چیرۆکی دایکمان عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا باس دەکەین بۆ ئەوەی عوزرەکەی بزانیت:**

کاتێك عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا هات بۆ حەج لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەیتوانی عومرە بکات پێش حەج چونکە تووشی سووڕی مانگانە بوو. کاتێك کە تەواو بوون لە حەج عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دڵی توند بوو و دەگریا بەوەی کە هەموو خەڵك عومرە و حەجیان کرد تەنها ئەو نەبێت بۆیە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناردی لە حەرەم بچێتە دەرەوە تا گەیشتە تەنعیم بۆ ئەوەی عومرە بکات وە دڵی عائشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا رازی بێت.

❌ سونەت نیە لە یەك سەفەردا چەندین عومرە بکەی چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە یەك سەفەردا تەنها یەك عومرەی دەکرد وە هیچ جار بۆ عومرەکردن لە مەککە نەچویتە دەرەوە و بگەڕێتەوە؛

❌ ئەگەر کەسێك حەزی کرد موخالەفەی سونەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکات و عومرەیەکی دیکە بکات، ئەوا دەبێت بگەڕێتەوە میقات (نەك مزگەوتی عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) و بچێتە ژێر ئیحرام ئەوجا بگەڕێتەوە مەککە بۆ ئەنجامدانی عومرە.

## لە میقات:

( لبَّيْكَ اللَّهُـمَّ عُمْرَةً لا رِياءَ فيها ولا سُمْعَـــةَ)

ئەگەر ترست هەبوو نەتوانی عومرەکەت تەواو بکەی بەهۆی نەخۆشی یان هەر شتێك بڵێ:

( اللَّهُـــمَّ مَحلِّي حيثُ حَبَسْتَني ).

## لە ڕێگای نێوان میقات و مکە

تەلبیە: ( لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ, لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ,
إنَّ الحَمْدَ والنِّعْمَـةَ لَكَ والْمُلْكَ لا شَرِيكَ لَكَ ).

یان: ( لَبَّيكَ إلـهَ الحَقِ )

## چوونە ناو مزگەوت:

(( اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلِّمْ,
اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أبْوابَ رَحْمَتِكَ ))

## لە کاتی بینینی کەعبە یەکە مجار:

( اللَّهُمَّ أنتَ السَّلامُ, ومِنكَ السَّلامُ, فَحَيِّنا رَبَّنا بالسَّلام )

## طواف

لە بەرامبەر حجر الأسود: ( بسم اللّه, اللّه أكبر)

لە نێوان ركن اليمانی و حجر الأسود:

(رَبَّنَا آتِنَا في الدُّنيَا حَسَنَةً، وفي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

دوای تەواوکردنی شەوتەکانی طواف: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗى﴾

پاشان دوو ڕەکاعەت نوێژ دەکەی

## صەفا و مروە

له نزيك صفا : ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ﴾

پاشان دەلێی : ( نَبْدَأُ بما بَدَأَ اللّهُ بِــــهِ ).

پاشان لەسەر كێوی صەفا ئەو زيكرە دەڵێ ی :

(اللّهُ أكـبْرُ, اللّهُ أكـبرُ, اللّهُ أكبرُ, لا إلـهَ إلا اللّهُ, وَحْدَهُ لا شَريكَ لَـهُ,
لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ, يُحْيي ويُميتُ, وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ,
لا إلَهَ إلا اللّهُ وَحْـدهُ, أنـْجزَ وَعْدَهُ, ونصرَ عَبـْدَهُ, وهَزَمَ الأحْزابَ وَحـْدَهُ )

( سێ جار )

ئەو زيكرە لە سەر چياى صەفا و لەسەر چياى مەروە دووبارە دەكەيەوە
وە لەنێوان هەرجارەك دوعا دەكەی

لە نێوان صەفا و مروە هيچ دوعايەك لە پێغەمبەر ﷺ نەهاتووە تەنها
ئەم دوعايەی خوارەوە لە هەندێك صەحابە هاتووە بە تايبەت لەنێوان هەردوو
نيشانە سەوزەكە:

( ربِّ اغفر وارحم؛ إنك أنت الأعز الأكرم ).

## پاش تەواوکردنی عومرە, کەسی حاجی

- لە ژێر ئیحرام دێتە دەرەوە
- جل و بەرگی ئاسایی خۆی لەبەر دەکات
- هەموو ئەو شتانەی لەسەری حەرام بوو بەخۆی ئیحرام حەلال دەبێت بۆی
- لە شاری مەککەی دەمێنێتەوە تاکو ڕۆژی ٨ی ذي الحجة کردەوەکانی حەج دەستپێدەکات هەروەکو لە لاپەڕەکانی داهاتوو باس کراوە؛

لە بەیانی ڕۆژی ٨ی ذي الحجة ( ڕۆژێك پێش ڕۆژی عەرەفە کە پێ ی دەگووترێت ڕۆژی الترویە ) سونەتە کەسی حاجی بچێتە ژێر باری ئیحرام هەروەکو شێوەی سەرەتا خۆی ئامادە کرد بۆ عومرە,
بەڵام ئەگەر لەو ڕۆژە بۆی نەکرا ئەوا **کێشەی نیە** و دەتوانێت ڕۆژی عەرەفە بچێتە ژێر باری ئیحرام.

## چوونە ژێر باری ئیحرام بەم شێوەی خوارەوە






1. پێش چوونە ژێر ئیحرام خۆشووشتن سونەتە
2. بۆن خۆش کردنی سەر و لاشە بۆ **پیاوان** سونەتە
( نابێت بۆن لە جل و بەرگی ئیحرام بدرێت )
3. لەبەر کردنی جل و بەرگی ئیحرام بۆ پیاوان
کە بریتیە لە دوو پارچە قوماش ( رداء ) بۆ داپۆشینی بەشی سەرەوەی لاشە و ( إزار ) بۆ داپۆشینی بەشی خوارەوەی لاشە





پیاو نابێت هیچ شتێك لەسەر سەری بێت ڕاستەوخۆ ( وەکو کڵاو و جامانە )
پیاو نابێت جل و بەرگێك لەبەر بکات کە دوورابێت بە قەدەر لاشەی
( واتا : شوێنی دەست و پێ و ملی دروستکرابێت )





4. ئافرەت بە جل و بەرگی ئاسایی خۆی ئیحرام دەکات





❌ وە نابێت دەست کێشی لە دەست بێت
❌ وە نابێت نیقاب بکات بەشێوەیەك کە بەدەم وچاوی نووسابێت
بەڵکو دروستە ئەگەر لەسەر سەری هاتبێتە خوارەوە وە نە نووسابێت بە دەم و چاوی ڕاستەوخۆ ( بە تایبەت ئەو کاتەی پیاوی بێگانە دەیبینن )

پاش خۆ ئامادەکردن بۆ ئیحرام وە لەبەر کردنی جلی ئیحرام بۆ پیاوان, دەبێت بچیتە ژێر باری ئیحرام بەم کردەوانەی خوارەوە:

1. هێنانی نیەت بەدڵ (کە دەچیتە ژێر ئیحرام)
2. ووتنی تەلبیە بە مەبەستی چوونە ژێر ئیحرام:

(لَبَّيكَ اللَّهُمَّ حجاً لا رِيَاءَ فيه وَلا سُمعَة)

(لبَّيكَ اللَّهمَّ لبَّيكَ، لبَّيكَ لا شريكَ لَكَ لبَّيكَ إنَّ الحمدَ والنِّعمةَ لَكَ والملكَ ، لا شريكَ لَكَ)

دەست دەکەیت بە تەلبیە لێدان تاکو ڕۆژی یەکەمی جەژن (١٠ی ذي الحجة)

لێرەوە هەموو ئەو شتانە حەرام دەبێتەوە لەسەرت هەروەکو ئەوەی باسکرا لە کاتی چوونە ژێر باری ئیحرام بۆ عومرە؛

ئەگەر ترست هەبوو لەوەی نەتوانی عومرەکەت تەواو بکەیت لەبەر نەخۆشی یان هەر هۆکارێکی دیکە, ئەوا بۆت هەیە بلێی (اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي),

## پاشان بەرەو منى (مینا) بە ڕێ دەکەویت

- لە منى نوێژەکان کورت دەکەیتەوە بێ ئەوەی جەمع بکەیت
  واتا (نوێژی نیوەڕۆ ٢ رکاعەت لەکاتی خۆی, نوێژی عەسر ٢ رکاعەت لەکاتی خۆی, نوێژی مەغرەب ٣ رکاعەت لەکاتی خۆی, نوێژی عیشا ٢ رکاعەت لەکاتی خۆی)
- سونەتە کەسی حاجی شەو لە مینا (منى) بمێنێتەوە وە نوێژی بەیانی لە منى بکات وە بمێنێتەوە تاکو خۆری ڕۆژی ٩ی ذي الحجة (ڕۆژی عەرەفە) هەڵدێت؛ پاشان بەرەو عەرەفە بەڕێ بکەوێت
- ئەگەر لە منى نەمایەوە ئەوا لەو شوێنەی لێیەتی لە ڕۆژی ٩ی ذي الحجة (ڕۆژی عەرەفە) بەرەو عەرەفات بەڕێ دەکەوی.



ناوچەی منى (مینا)

- لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ٩ی ذي الحجة (ڕۆژی عەرەفە) بەرەو ناوچەی عەرەفە بەڕێ دەکەوی بەلەسەر خۆیی و بێ عەجەلە؛
- لە ڕێگا سونەتە: تەلبیە لێ بدەی (لبّيكَ اللّهمَّ لبَّيكَ، لبّيكَ لا شريكَ لكَ لبّيكَ إنَّ الحمدَ والنِّعمةَ لَكَ والملكَ، لا شريكَ لَكَ)

وە سونەتە تەکبیرات لێبدەی

(الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر ولله الحمد)

- ئەگەر ئاسان بێت و بۆت کرا, سونەتە پێش ئەوەی بگەیتە عەرەفە لە نەمرە بمێنیتەوە تاکو بانگی نیوەڕۆ؛
- پاشان دەمێنیتەوە بۆ ووتاری ڕۆژی عەرەفە؛

وە ٢ رکاعەت نوێژی نیوەڕۆ و ٢ رکاعەت نوێژی عەسر لەکاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام دەدەی,

- ❌ هیچ نوێژێکی سونەت نیە لێرەدا نە لە پێش نوێژ لە نێوان هەردوو نوێژ وە لە دوای نوێژ؛
- ❌ نەمرە بەشێك نیە لە ناوچەی عەرەفە

- پاشان تەواو بوونی ووتار و ئەنجامدانی هەردوو نوێژ بەڕێدەکەوی بۆ ڕاوەستان لە ناوچەی عەرەفە



مزگەوتی نەمرە

چەندین هێما و ڕێنمایی دانراوە بۆ دیاریکردنی سنوری نەمرە و سنووری عەرەفە

## ڕاوەستان لە عەرەفە ڕوکنی گەورەی حەجە

- ئەگەر بۆت کرا لە نزیك ئەو بەردانەی لە خوارەوەی جبل الرحمة ڕادەوەستی, ئەگەر نەکرا ئەوا لەهەر شوێنێکی عەرەفە بوەستی کێشەی نیە ,
- واجبە لەعەرەفە بمێنیتەوە تاکو ڕۆژی عەرەفە ئاوا دەبێت؛
- ✗ حەج کردنەکەت دروست نیە ئەگەر پێش نیوەڕۆ عەرەفە جێ بهێلی؛

- ڕۆژی عەرەفە ڕۆژێکی گەورەیە , پێویستە کەسی حاجی خۆی خەریك بکات بە زیکر و دوعا و پاڕانەوە لە خوای گەورە بەتایبەتی ووتنی:

(لا إله إِلا الله وحده لاَ شرِيك لَه، لَه الملك، وَلَه الحمد، وَهو علَى كل شيء قدير)

### هەندێك تێبینی گرنگ:

- ✗ لە ڕۆژی عەرەفە سونەت وایە کەسی حاجی بەڕۆژوو نەبێت لەبەر ئەوەی پێغەمبەر و صەحابەکان بەڕۆژوو نەبوون لەو ڕۆژەدا؛
- ✗ هەر کەسێك لە ڕۆژی عەرەفە لە ناوچەی عەرەفە ڕانەوەستیٚ و ئامادە نەبێت ئەوا حەجی بەتاڵە؛
- ✗ زۆر گرنگە دڵنیابی لەوەی لە ناوچەی عەرەفە ڕاوەستای نەك دەرەوە وە چەندین هێما و نیشانە دانراون بۆ ئەو مەبەستە؛
- ✗ کەسی حاجی پێویست ناکات ڕووی بکاتە چیای عەرەفە (جبل الرحمة) بۆ دوعاکردن بەڵکو ڕووی خۆی دەکاتە قیبلە؛
- ✗ سونەت نیە بچیتە سەر چیای ڕەحمە؛
- ✗ پێویستە خۆت بەدوور بگری لە کێشە دروست کردن و ئەزیەت دانی خەڵك لەو ڕۆژەدا؛

- کە ڕۆژ ئاوابوو, ئەوا بەرەو مزدلفە بەڕێ دەکەوی بەلەسەر خۆیی و بێ دروستکردنی قەلەباڵغی؛



چیای الرحمة و ناوچەی عەرەفە

- لەگەڵ ڕۆژ ئاوابوونی ڕۆژی عەرەفە کەسی حاجی بەرەو مزدلفە بەڕێ دەکەوێت بە لەسەر خۆیی بێ عەجەلە ؛
- کە گەیشتە مزدلفە , ٣ ڕکاعەت نوێژی مەغریب ئە نجام دەدات پاشان ٢ ڕکاعەت نوێژی عیشا ئە نجام دەدات ؛
- لە مزدلفە لە هەر شوێنێك بمێنیتەوە کێشەی نیە ؛
- لە مزدلفە دەمێنیتەوە تاکو بانگی بەیانی ؛
- زۆر گرنگە : واجبە نوێژی بەیانی لە مزدلفە بکەی پێش ئەوەی مزدلفە جێ بهێڵی ؛

تەنها ئافرەتان و کەسانی زەعیف و لاواز ( وە ئەوانەش لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەن ) بۆیان هەیە مزدلفە جێ بهێڵن پێش بانگی بەیانی ؛

- پاشان پێش ڕۆژ هەڵات ئەو کاتەی دنیا بەرەو ڕووناك بوون دەچێت, بەرەو منی بەڕێ دەکەویت ؛
- لە ڕێگای خۆت سونەتە بەرد هەڵبگریتەوە بۆ بەرد هاوێشتن لە ڕۆژی جەژن بەڵام واجب نیە ؛

ڕۆژی ١٠ی ذي الحجة کە بریتیە لە ڕۆژی یەکەمی جەژن کە پێ ی دەگوترێت یوم النحر واتا ڕۆژی سەربڕینی ئاژەڵ

لەو ڕۆژەدا کەسی حاجی ٤ کردەوەی هەیە ئەنجامی بدات:

١. هاویشتنی بەرد (کە هاوێشتنی یەکەمە پێ ی دەگوترێت جمرة العقبة)
٢. سەربڕینی ئاژەڵ
٣. تاشین یان کورتکردنەوەی پرچی سەر
٤. طواف کردنی ئیفاضە وە هاتن و چوون لە نێوان صەفا و مەروە

- ئەو کردەوانە باشتر وایە بە ترتیب بکرێت بەڵام پێش و پاشیش بکرێت دروستە؛
- کە لە (هاویشتنی بەرد و قژ تاشین و طواف و هاتن و چوون لە نێوان صفا و مەروە) تەواو بوویت ئەوا لە ژێر باری ئیحرام دێیتە دەرەوە و هەموو ئەو شتانەی لەسەرت حەرام بوو بەهۆی ئیحرام، حەلال دەبێتەوە.
- سەربڕینی ئاژەڵ لە هەر چوار ڕۆژی جەژن دروستە؛

## یەکەم کردەوەی ڕۆژی جەژن : هاویشتنی بەرد :

- سونەتە لەو کاتەی لە مزدلفە بەرەو منی دێ ی هەندێك بەرد کۆ بکەیتەوە بۆ هاوێشتن, بەلام ئاساییە لەهەر شوێنێکی دیکەش بەرد هەڵبگریتەوە؛
- هاوێشتنی بەرد: بریتیە لە هاوێشتنی حەفت بەردی مامناوەند کە هەندەك گەورەتر بێت لە دەنکە نۆك؛
- هاوێشتی بەردی ڕۆژی یەکەمی جەژن لە دوای ڕۆژ هەلات دەست پیێ دەکات کە پیێ ی دەگووترێت (رمي جمرة العقبة)؛
- هاوێشتی بەردی ڕۆژی یەکەمی جەژن لە هەر کاتێکی ڕۆژ بێت دروستە بەلام دوای ڕۆژهەلات ڕاستەوخۆ باشترە؛
- هەر کەسێك بەهۆی عوزرێك نەیتوانی لەکاتی ڕۆژدا بەردەکان فرێبدات ئەوا ئاساییە لەدوای ڕۆژئاوابوون بەردەکان فرێبدات؛

## چۆنیەتی هاوێشتنی بەرد

- بەرامبەر شوێنی بەرد هاوێشتن ڕادەوستی وە شاری مکە دەکەیتە دەستە چەپت وە منی دەکەیتە دەست ڕاستت؛
- لەگەڵ هاوێشتنی هەر بەردێك سونەتە بلێیت (الله أكبر)
- لەگەل دەستکردن بە هاوێشتنی بەردەکان لە تەلبیە لێدان ڕادەوەستی؛

✗ هاوێشتنی بەرد پێش ڕۆژ هەلات دروست نیە ؛


الجمرة الصغرى


الجمرة الوسطى


الجمرة الكبرى
(العقبة)

## دووەم کردەوەی ڕۆژی جەژن: سەربڕینی ئاژەڵ:

- سەربڕینی ئاژەڵ لە ڕۆژی یەکەمی جەژن (١٠ی ذي الحجة) وە ڕۆژەکانی دوای ئەویش دروستە (١١ و ١٢ و ١٣) کە پێیان دەگووترێت أيام التشريق؛
- سەربڕین تەنها لە شاری مکە و منی دەبێت؛ بەڵام باشترین شوێن ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئاژەڵی لێ سەر بڕیوە کە پێ ی دەگووترێت (المنحر)
- لەکاتی ئێستادا, باشترین ڕێگا بۆ سەربڕینی ئاژەڵ ئەوەیە خۆت بچیتە شوێنی ڕەسمی حکومی و لەوێ بۆت سەر ببڕن؛
- لەکاتی سەربڕین سونەتە بڵێی:

(بسم الله, والله أكبر, اللهم إنَّ هذا منك و لك, اللهم تقبل مني)؛

- دروستە لە ئاژەڵی خۆت بخۆیت و دروستە گۆشتەکەی هەڵبگریت؛
- وە سونەتە هەندێك لە گۆشتەکە بکەیتە خێر و صەدەقە؛
- ✗ دروست نیە و سەر بڕینی ئاژەڵت لەسەر هەڵناستێت ئەگەر پێش ڕۆژی جەژن ئاژەڵ سەر ببڕی؛

## سێیەم کردەوەی ڕۆژی جەژن: تاشین یان کورت کردنەوەی قژی سەر:

- واجبە لەسەر پیاو قژی سەر بە تەواوی بتاشێ یاخود کورتی بکاتەوە؛
- واجبە لەسەر ئافرەت قژی کۆ بکاتەوە و بەقەدەر یەك سەرە پە نجە ببڕێت؛

**تێبینی 1:** قژ تاشین بەتەواوی باشترە لە کورت کردنەوە, چونکە پێغەمبەر ﷺ سێ جار دوعای لێخۆشبوونی بۆ ئەو کەسانە کرد کە سەریان تاشی و تەنها یەك جار دوعای لێخۆشبوونی بۆ ئەو کەسانە کرد کە قژیان کورت کردەوە.

**تێبینی 2:** دروست نیە پیاو تەنها بەقەدەر پە نجەیەك پرچی کورت بکاتەوە وەکو ئافرەت, بەڵکو واجبە پیاو هەموو سەری بتاشێت یان کورتی بکاتەوە چۆن لە کاتی ئاسایی دەچێتە لای سەرتاش (حلاق). چونکە بەو شێوەیە خوای گەورە وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان کردووە.

## چوارەم کردەوەی ڕۆژی جەژن: طواف کردن و هاتن و چوون لە نێوان صەفا و مەروە

- طواف دەکەی بەدەور کەعبە پاشان هاتن و چوون دەکەی لە نێوان صەفا و مەورە
- ئەو دوو کردەوەیە روکنێکە لە روکنەکانی حەج
- ئەو طوافە پێ ی دەگووترێت إفاضە: واتا هاتنە خوارەوە و گەڕانەوە بۆ ماڵ (شوێنی مانەوە)

### چۆنیەتی ئە نجامدانی طواف

**1.** کە ویستت طواف دەست پێبکەی دەچیتە بەرامبەر حجر الأسود:

- ١– ئەگەر بتوانی ئەوا ماچی دەکەی وە دەڵێی (بسم الله, الله أكبر), ئەگەر نەکرا ئەوا
- ٢– دەستت بە حجر الأسود دادەهێنی و دەستی خۆت ماچ دەکەی و دەڵێی (بسم الله, الله أكبر), ئەگەر بۆت نەکرا ئەوا
- ٣– لە دوورەوە یەك دەستی بۆ بەرز دەکەیەوە (بێ ئەوەی دەستت ماچ بکەی) و دەڵێی (بسم الله, الله أكبر)

ئەو سێ حالەتەی سەرەوە لە سەرەتای هەر ٧ جار سوڕانەوەکان دەبێت.







**2.** کە دەست دەکەی بە طواف کردن, دەبێت کەعبە لە لای دەستی چەپت بێت

- ✗ سونەت نیە لەو گوافە پیاوان لە سێ جاری یەکەم بەشێوەیەکی خێراتر بڕۆن (رمل) وە شانیان بهەژێنن
- ✗ سونەت نیە پیاوان لەکاتی ئەو طوافەلەژێر جلی إحرام شانی ڕاستیان دەربهێنن (إضطباع)






3. سونەتە کە گەیشتیە رکن اليمانی دەستی پێدا بهێنی
(بێ ماچ کردن و بێ ووتنی هیچ شتێك)
ئەگەر بۆت نەکرا دەستی پێدا بهێنی (ئەوا ئیشارەی بۆ ناکەی)

4. سونەتە لە نێوان رکن اليمانی (A-) و حجر الأسود (B-) بڵێی
(رَبَّنَا آتِنَا في الدُّنْيَا حَسَنَةً، وفي الآخرَةِ حَسَنَةً، وقِنَا عذَابَ النَّارِ)

5. کە گەیشتیەوە حجر الأسود ئەوا یەك سوڕانەوە تەواو بوو




6. دوای تەواو بوونی حەفت جار سووڕانەوە بە دەوری کەعبە ,
ئەگەر بۆت کرا سونەتە بچیتە لای (ملتزم)
کە دەکەوێتە نێوان حجر الأسود و دەرگای کەعبە
سینگ و دەم و چاو و دەست و قوڵی پێوە بنووسێنیت وە دوعا بکەی




5. پاشان دەچیتە بەرامبەر مقام وە ئەو ئایەتە دەخوێنی
﴿وَاتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبۡرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾

6. پاشان دوو رکاعەت سونەت ئە نجام دەدەی لە پشتی مقام یان هەر شوێنێکی دیکەی مزگەوت

- لە رکاعەتی یەکەم لە دوای فاتیحە سونەتە [سورة الكافرون] ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾ بخوێنی
- وە لە رکاعەتی دووەم لە دوای فاتیحە سونەتە [سورة الإخلاص] ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنی




7. پاشان دەچی بەرەو ئاوی زەمزەم و دەخۆیەوە بە زۆری وە بەسەری خۆت دادەکەی

8. پاشان دەچیتە بەرامبەر حجر الأسود, ئەگەر بتوانی ئەوا ماچی دەکەی وە دەڵێی (بسم الله, الله أکبر)
ئەگەر نەکرا ئەوا دەستت بە حجر الأسود دادەهێنی و دەستی خۆت ماچ دەکەی و دەڵێی (بسم الله, الله أکبر)
ئەگەر بۆت نەکرا ئەوا لە دوورەوە دەستی بۆ بەرز دەکەیتەوە (بێ ئەوەی دەستت ماچ بکەی)
و دەڵێی (بسم الله, الله أکبر)

9. ئەلێرە طواف کردنەکەت تەواو بوو.

## لە دوای تەواو بوون لە طواف بەرەو صەفا و مەروە دەڕۆیت

- صەفا و مەروە بریتین لە دوو چیا
- کە لە چیای صەفا نزیك بوویە ئەو بەشەی ئایەت دەخوێنیتەوە: ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ﴾
- پاشان دەڵێ: (نَبْدَأُ بما بَدَأَ اللهُ بِــه)
- پاشان دەچیتە سەر چیای صەفا تاکو کەعبەت لێ بە دیاردەکەوێت وە روو دەکەیتە کەعبە وە دەستەکانت بەرز دەکەیتەوە و ٣ جار دەڵێ:

((لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الـمُلْكُ ولَهُ الـحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ،
لَا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ))

- وە لەنێوان هەرجارێك دوعا دەکەیت بەو دوعایانەی کە خۆت دەتەوێت.

- پاشان بەرەو چیای مەروە بەرێ دەکەوی بە ڕۆیشتن,
- کە گەیشتیتە هێما سەوزەکە بۆ پیاوان سونەتە بەخێرایی بڕۆی (ڕاکردن) تا دەگەیتە هێمای سەوزی دووەم دیسان ڕۆیشتنی ئاسایی دەکەی تاکو دەگەیتە چیای مەروە

- بەهەمان شێوە سەردەکەویتە سەر چیای مەروە تاکو کەعبەت لێ دیاردەکەوێت وە روو دەکەیتە کەعبە وە دەستەکانت بەرز دەکەیتەوە وە ٣ جار دەڵێ:

((لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الـمُلْكُ ولَهُ الـحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ،
لَا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ))

- وە لەنێوان هەرجارێك دوعا دەکەیت بەو دوعایانەی کە خۆت دەتەوێت.

- پاشان بەرێدەکەوی بۆ گەڕانەوە بەرەو چیای صەفا,

بەم شێوەیە ٧ جار هاتن و چوون لەنێوان صەفا و مەروە دەکرێت

صفا --١-> مروة --٢-> صفا --٣-> مروة --٤-> صفا --٥-> مروة --٦-> صفا --٧-> مروة

- ✗ لەکۆتا جار کە دەگەڕێیتەوە چیای مەروە, ئەو دوعایە سەرەوە ناخوێنی
- ✗ لە نێوان صەفا و مروە هیچ دوعایەك لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهاتووە
- ✗ تەنها ئەم دوعایەی خوارەوە لە عبداللە ی کوڕی مەسعود و عبداللە کوڕی عومەر هاتووە[1] بە تایبەت لەنێوان هەردوو نیشانە سەوزەکە: (ربِّ اغفر وارحم؛ إنك أنت الأعز الأكرم)
- هاتن و چوون لەنێوان صەفا و مەروە, لە صەفا دەست پێدەکەیت وە لە مەروە کۆتایی پێدێت

1. ابن ابي شيبة (68/4 و 69)

چیای صەفا

دەستپێك

چیای مەروە

کۆتایی (لە کۆتا جار گەیشتن بە مەروە دوعا ناخوێنی لێرە)

1 2 3 4 5 6 7

ڕۆیشتنی ئاسایی

ڕۆیشتنی خێرا ڕاکردن

ڕۆیشتنی ئاسایی

**لەسەر هەردوو چیا**

روو کردنە قیبلە وە بەرزکردنەوەی دەستەکان وە 3 جار دەڵێی: (( لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الـمُلْكُ ولَهُ الـحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شيءٍ قَدِيرٌ،
لَا إلَه إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ))
وە لەنێوان ووتنی هەرجارێك ئەو زیکرە سونەتە دوعا بکەیت بەو دوعایانەی کە خۆت دەتەوێت.

ڕۆژانی ١١ و ١٢ و ١٣ ی ذي الحجة, کە دەکاتە ڕۆژانی دووەم و سێیەم و چوارەمی جەژن (أيام التشريق)

- لەو ٣ ڕۆژە کەسی حاجی واجبە لە منی بمێنێتەوە؛
- ناباێت بگەڕێیتەوە شوێنی مانەوەی خۆت لە مکە یان هەر شوێنێکی دیکە. تەنها ئەو کەسانەی عوزریان هەیە دەتوانن لە منی نەمێننەوە؛
- لەو سێ ڕۆژە کەسی حاجی پێویستە بەلایەنی کەم نیوەی کاتی شەو لە منی بمێننەوە واتا ئەگەر لە بانگی مەغریب تاکو بانگی بەیانی ١٢ سەعات بێت ئەوا پێویستە کەسی حاجی بەلایەنی کەم ٦ سەعات لە منی بێت؛
- سونەتە لەو شەوانە سەرەدانی کەعبە بکەی بەمەبەستی طواف کردن؛
- لەو چەند ڕۆژە کەسی حاجی پێویستە نوێژەکانی بە جەماعەت ئەنجام بدات بەتایبەت لە مزگەوتی خیف ئەگەر بۆی کرا چونکە ٧٠ پێغەمبەر عليهم الصلاة و السلام لەو مزگەوتە نوێژیان کردووە.

## لەو سێ ڕۆژە کەسی حاجی هاوێشتنی بەردی لەسەر واجبە

- هاوێشتی بەرد لەو سێ ڕۆژە دوای نوێژی نیوەڕۆ دەستپێدەکات وە دروست نیە پێش نیوەڕۆ ئەنجامی بدەیت؛
- هەر ڕۆژەی ٢١ بەرد فڕێدەدات, کە کۆی گشتی هەر سێ ڕۆژ دەکاتە ٦٣ بەرد.
- لە دوای تەواوکردنی بەرد هاوێشتن و پێش ڕۆژئاوابوونی ڕۆژی ١٣ی ذي الحجة کە دەکاتە چوارەم ڕۆژی جەژن منی جێدەهێلیت؛
- کەسی حاجی بۆی هەیە منی جێ بهێلێت دوای هاوێشتنی بەرد و پێش ڕۆژئاوابوونی ڕۆژی ١٢ی ذي الحجة کە دەکاتە سێیەم ڕۆژی جەژن کە پێی دەووترێت التعجيل وە لەو حاڵەتە کۆی گشتی ٤٢ بەرد فڕێدەدات, بەڵام مانەوە بۆ ڕۆژی چوارەم سونەتە و خێری زیاترە و باشترە. بەڵام ئەگەر پێش ڕۆژ ئاوابوون دەرنەچووی ئەوا واجبە بۆ ڕۆژی چوارەم بمێنیتەوە وە ناتوانی تەعجیل بکەی.

### چۆنیەتی بەرد هاویشتن لەو سێ ڕۆژەدا :

- لە شوێنی بەرد هاوێشتنی یەکەم دەست پێدەکەیت کە نزیکترینیانە لە مزگەوتی الخیف,
- حەفت بەرد فڕێ دەدەیتە شوێنی بەرد هاوێشتن؛
- لەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێك سونەتە بڵێی ( الله أكبر )؛
- کە لە هاوێشتنی ٧ بەردی یەکەم تەواو بووی سونەتە کەمێك بچیتە پێش بە لای ڕاست, وە ڕووی خۆت بکەیتە قیبلە و ماوەیەکی زۆر ڕابوەستی و دەستت بەرزبکەیتەوە و زۆر دوعا بکەی بەو دوعایەی کە خۆت دەتەوێت؛

پاشان دەچیتە بەرامبەر شوێنی بەرد هاوێشتنی دووەم و حەفت بەرد فڕێ دەدەیتە شوێنی بەرد هاوێشتن؛

- لەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێك سونەتە بڵێی ( الله أكبر )
- کە لە هاوێشتنی ٧ بەردی دووەم تەواو بووی سونەتە کەمێك بچیتە پێش بە لای چەپ, وە ڕووی خۆت بکەیتە قیبلە و ماوەیەکی زۆر ڕابوەستی و دەستت بەرزبکەیتەوە و زۆر دوعا بکەی بەو دوعایەی کە خۆت دەتەوێت؛

پاشان دەچیتە شوێنی بەرد هاوێشتنی سێیەم جمرة العقبة, کەعبە دەکەیتە لای چەپت وە منی دەکەیتە لای ڕاستت حەفت بەرد فڕێ دەدەیتە شوێنی بەرد هاوێشتن؛

- لەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێك سونەتە بڵێی ( الله أكبر )
- پاشان ئەو شوێنە جێ دەهێڵی بێ ڕاوەستان و بێ دوعاکردن.




- کە لە هاوێشتنی بەرد تەواو بووی ئەوا **کارەکانی حەج کۆتایی هات** وە دەگەڕێیتەوە مکە وە لەوێ دەمێنیتەوە تاکو بەرەو ماڵ بەڕێ دەکەویت.




پاشان ئەو شوێنە جێ دەهێلی بێ ڕاوەستان و بێ دوعاكردن ٦



( جمرة العقبة )

٥

پاشان دەچیتە شوێنی بەرد هاوێشتنی سێیەم جمره العقبه , كەعبە دەكەیتە لای چەپت وە منی دەكەیتە لای ڕاستت

حەفت بەرد فڕێ دەدەیتە شوێنی بەرد هاوێشتن لەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێك سونەتە بڵێی ( الله أكبر )؛




٤

ڕووی خۆت بكەیتە قیبلە و ماوەیەكی زۆر ڕابوەستی و دەستت بەرزبكەیتەوە و زۆر دوعا بكەی بەو دوعایەی كە خۆت دەتەوێت؛

پاشان سونەتە كەمێك بچیتە پێش بە لای چەپ




٣

حەفت بەرد فڕێ دەدەیتە شوێنی بەرد هاوێشتن لەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێك سونەتە بڵێی ( الله أكبر )؛

٢

ڕووی خۆت بكەیتە قیبلە و ماوەیەكی زۆر ڕابوەستی و دەستت بەرزبكەیتەوە و زۆر دوعا بكەی بەو دوعایەی كە خۆت دەتەوێت؛




پاشان سونەتە كەمێك بچیتە پێش بە لای ڕاست

١

حەفت بەرد فڕێ دەدەیتە شوێنی بەرد هاوێشتن لەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێك سونەتە بڵێی ( الله أكبر )؛

کە گەڕایتەوە مەککە لەوێ دەمێنیتەوە تاکو خوای گەورە بۆت ئاسان دەکات و دەگەڕێیتەوە وولاتی خۆت,

- ✅ لەو چەند ڕۆژەی لە مەککە دەمێنیتەوە وا باشە خۆت بە خواپەرستی و عیبادەت مشغول بکەی بەتایبەت نوێژەکان لە مزگەوتی حەرام ئەنجام بدەی لەبەر ئەوەی لەو مزگەوتە یەك نوێژ خێری زیاتر لە سەد هەزار نوێژی هەیە؛
- ✅ هەروەها زۆر طواف بکەی؛
- ✅ وە هەر جۆرە عیبادەتێکی دیکە بێت کە خوای گەورە بۆت ئاسان دەکات لە زیکر و قورئان خوێندن و صدقە و قسەی باش و هتد؛
- ❌ وە لەو چەند ڕۆژە خەڵك ئەزیەت نەدەی عەجەل و خێرایی نەکەی لە گەڕانەوە بۆ ماڵ بەڵکو صبر و ئارامت هەبێت؛

## طوافی ماڵئاوایی ( طواف الوداع )

کە کەسی حاجی هیچ ئیشی لە مەککە نەما و نیەتی هێنا مەککە جێبهێڵێت **واجبە لەسەری** طوافی ماڵئاویی بکات,

✅ ئەو طوافە وەکو هەر طوافێکی ئاساییە بە جل وبەرگی خۆت ئە نجامی دەدەی؛

❌ دوای ئەو طوافە, نابێت بگەڕێیتەوە ناو مزگەوتی الحرام وە دەبێت ئەوە کۆتا دیدارت بێت لەگەڵ کەعبە لەو سەفەرەت هەر لەبەر ئەوە ناوی نراوە بە طواف الوداع واتا ماڵئاوایی؛

❌ لەمزگەوتی حەرام دەردەچی بەشێوەی ئاسایی نەك پاشەو پاش لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە گەڕانەوەیە هیچ بەڵگەی قورئان و سونەتی لەسەر نیە ؛

✅ کەسی حاجی بۆی هەیە ئاوی زەمزەم هەڵبگرێت وە لەگەڵ خۆی بیبات بۆ ماڵ بە مەبەستی شیفا و ئاودانی خەڵك؛

**ـ کۆتایی ئەم کتێبە ـ**

**الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات**

**اللهم صل وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

**چۆنیەتی ئەنجامدانی حەج بە گوێرەی بەڵگە شەرعییەکان**

**مافی ئەم بەرهەمە پارێزراو نیە**

**واتا هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە چاپ و کۆپی بکات بۆ بڵاوکردنەوە**

**بۆ داواکردنی ئەم کتێبە بە شێوەی PDF تکایە پەیوەندی بەو ژمارە یان ئیمێڵەی خوارەوە بکە ,**
**یان ئەم بارکۆدەی خوارەوە سکان بکە**

**هەر کەسێك هەڵەیەکی بینی لەم کتێبە تکایە ئاگادارمان بکاتەوە لەسەر ئەم ژمارەی خوارەوە ,**


**ئیمێڵ :** muhammadblackstone@gmail.com

**ژمارەی مۆبایل :** 07508121914

**کەناڵی تیلیگرام :** https://t.me/zanstirast1439


**حوزەیران 2023**

**ذي القعدة 1444**

